# پەیامێك لە خراپی

# دڵـــڕەقـــی

لإمام حافظ ابن رجب الحنبلي ( رحمه الله )

٧٣٥-٧٩٥هـ

**وەرگێڕانی**

محمد دارا مستەفا

**پێداچوونەوەی**

م.کامەران عومەر رچە مچە مالی

بسم الله الرحمن الرحيم

تاکە شتێك کە هەموو مرۆڤی دونیا بە موسڵمان و غەیرە موسڵمان ، بە ڕەش پێست و سپی پێست و بە جیاوازی هەموو ڕەنگ و دەنگ و زمانێکەوە کە لەسەری کۆك و هاوڕا بن بریتیە لە گەڕان بە دوای بەختەوەری ناوەکی واتە دڵ ئارامی ، هەر یەکەی لە شوێنێك بە دوایدا دەگەڕێ بێ ئاگا لەوەی کە نزیکترین شتە لێوەی چونکە بەختەوەری مرۆڤەکان ڕێك لە ناخیاندایە و لە ناو دڵیانە بەڵام پێویستی بە ماندوو بوونە تاوەکو بتوانن بیدۆزنەوە ، هەموو شتێك پەیوەستە بە دڵەوە چاکی و خراپی مرۆڤەکان ، دڵڕەقی و میهرەبانی ، خۆشەویستی و ڕق لێبوون ، تەنانەت زۆر شتی تریش کە هەستی پێناکەین ، هەر لێرەشەوە تێدەگەین لە فەرمایشتی پیرۆزی سەروەری مرۆڤایەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە دەفەرموێت : «أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ». متفق عليه

واتە : ( بە دڵنیاییەوە لە ناو لاشەی مرۆڤەکان پارچەیەك هەیە ، کاتێك ئەو پارچەیە چاك بوو هەموو لاشە چاك دەبێت ، وە ئەگەر خراپ و فاسدیش بوو هەموو لاشە خراپ دەبێت ، ئاگادار بن ئەو پارچەیەش دڵە ).

جا دڵڕەق ـیش یەکێکە لەو نەخۆشیانەی کە زۆرێکمان بە دەستیەوە دەناڵێنین و بە دوای چارەسەری دەگەڕێین ، بێگومانیش چارەسەر نادۆزینەوە تاوەکو هۆکارەکانی نەزانین ، بۆ ئەم مەبەستەش ئیمامە بەڕێزەکانی پێشینانمان زۆر بابەت و پەرتوکیان نوسیوە لەم بارەیەوە ، کە

یەكێك لەوانە ئەم پەیامەی پێشەوا ابن رجب الحنبلي ـە كە برای خۆشەویستم كاك (محمد دارا ) هەستاوە بە وەرگێڕانی بۆ زمانی شیرینی كوردی تاوەكو میلەتی كوردزمانمان بتوانن سوودی لێ ببینن ، داواكارم لە پەروەردگار بیكاتە هۆكارێك بۆ بەخۆداچوونەوەی زۆرێكمان و بیكاتە توێشوویەك بۆی لە ڕۆژی پاداشت و سزا .

كامەران عومەر چەمچەماڵی

٣ / رمضان / ١٤٤٠

## پێشەکی وەرگێڕ :

**إن الحمد لله، نحمده، ونستعينه، ونستغفره، ونتوب إليه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، أرسله الله تعالى بالهدى ودين الحق، فبلغ الرسالة وأدى الأمانة، ونصح الأمة، وجاهد في الله حق جهاده، وترك أمته على محجة بيضاء ليلها كنهارها لا يزيغ عنها إلا هالك، فصلوات الله وسلامه عليه وعلى آله وأصحابه، وأئمته الهدى من بعدهم، ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.**

**أما بعد:**

**بە ڕاستی موسڵمانان لەم ڕۆژگارەدا بەگشتی وە ئەو کەسانەشی کە قوتابی زانستن ئاگایان لەدڵیان نەماوە بۆیە بەباشم زانی ئەم نامیلکەیە بخەمە بەردەستی خوێنەر تاوەکو سودی لێوەربگرن وە دڵەکانمان چی تر ئاوا ڕەق نەبن ، وە نەبێت کە ئەم نامیلکەیەم خوێندۆتەوە دڵی من نەرم بێت ناوالله بەڵام ئەمە بیر خەرەوەیە سەرەتا بۆخۆم پاشان بۆ ئێوە ، ئەم نامیلکەیە باسی هۆکاری دڵ نەرم بوون وە باسی ئەو هۆکارانە ئەکات کە ئەبێتە هۆی دڵ ڕەق بوون با تەنها خوێندنەوە نەبێت بەڵکو کاریگەری بکاتە سەر دڵت**

پاشان کردەوەکانت چونکە بەڕاستــی ئەگەر بەس خوێندنەوە بێت ئەوا ئەم نامیلکەیە لەچەند کاتێکی کەمدا ئەخوێنیتەوە تەواو ئیتــر بیــرت ئەچێتەوە بەڵام ئەگەر ئەوەی تێیدا باسکراوە کاریگەری بکاتە سەر دڵت بۆماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوە ، بە ئومێدی ئەوەی سودی هەبێت بۆتان ، لەدوعای خێر بێ بەشــمان مەکەن.

**✍ محمد بن دارا مصطفى**

٨/شعبان/١٤٤٠ هـ

بريطانيا / منجستر

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**نامەیەك باسی ڕەقی دڵ ئەكات باسی هۆكاری ڕەقی دڵ ئەكات ئەو شتانەی دڵ ڕەق ئەكات ئەو شتانەی ئەبێتە هۆی لابردنی ڕەقی دڵ.**

## باسی دڵ ڕەقی:

**پەروەردگار دەفەرموێت :**﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ﴾ **(البقرة : ٧٤)**

**واتە:لە دوای ئەم هەموو موعجیزانە دیسانەوە ئێوە لە جیاتی ئەوەی بەردەوام بن لەسەر تاعەت و عیبادەتی خوای گەورە دڵتان ڕەق بوو دڵتان وەکو بەرد ڕەق بووە یاخود ڕەقتر .**

**پاشان باسی ئەوە دەكات چۆن دڵی مرۆڤـ ڕەق بووە :** ﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ﴾ **.(البقرة: ٧٤)**

**واتە : لەناو بەردەكانیشدا هەیە ئەتەقێ و كانی ئاوی لێ دەرئەچێت ،وە هەیە لەت ئەبێت و ئاوی لێ دەرئەچێت ، هەیە لەسەر شاخەكان بەر ئەبێتە خوارەوە لە ترسی خوای گەورە ، بەڕاستی خوای گەورە بێئاگا نیە لەو كردەوانەی كە ئێوە ئەنجامی ئەدەن.**

بەرد هەیە لەترسی خوای پەروەردگار شەق ئەبێت بەڵام دڵی واهەیە بێ ئاگایە لەترسی خوای پەروەردگار ، (ئەمەش واتای ئەوەنییە هەر بەردێك ورد و خاش بوو بڵێی ئەمە لە ترسی خوا وای لێهاتووە نەخێروانییە بەڵام مجاهد ئەفەرمووێت: هەر بەردێك لەسەر شاخ بەربۆوە ئەوە لە ترسی خوای گەورەیە، هەر بەردێ شەقی بردو ئاوی لێ دەرچوو لە ترسی خوای گەورەیە، خواش زاناترە).

پەروەردگار دەفەرمویێت : ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ ( الحديد: ١٦)

واتە:ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە باوەڕداران دڵیان نەرم بێ لە کاتی زیکری خوای گەورەو بیستنی قورئان و خوێندنەوەی، وە لەو حەقەی کە لە قورئانەو بۆیان دابەزیوە تا ملکەچ و گوێڕایەڵ بن بۆی ، وەك ئەو کەسانە نەبن کە ئەهلی کتابن لە جوولەکەو گاورەکان کە پێش ئەوەی قورئان دابەزێ ئەمان کتابیان بۆ هاتبوو بەڵام کە سەردەمیان دوورکەوتەوە لە پێغەمبەرانیان دڵیان ڕەق بوو.

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت : ﴿أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾{الزمر: ٢٢}

واتە:ئایا کەسێك کە خوای گەورە سینگی کردۆتەوەو فراوان کردووە بۆ وەرگرتنی ئیسلام وە لەسەر نوورو ڕووناکیە لەلایەن خوای گەورەوە وەکو کەسێکی دڵڕەق وایە کە لە تاریکی و گومڕاییدا بێت و دوور بێت لە حەق؟ نەخێر هەرگیز یەکسان نین ، جا هەڕەشەی سەخت بۆ ئەو کەسە دڵڕەقانەی کە دڵیان ڕەقە لە ئاست زیکرو یادی خوای گەورەو وەرگرتنی حەقدا ، ئا ئەمانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

خوای گەورە باسی ئەهلی کیتاب کردووە بەوەی دڵ ڕەقن وە نەهی لێکردووین خۆمان بچوێنین بەوان لەوەی دڵمان ڕەق بێت ، هەندێك لەسەلەف دەفەرموون: : ( لا یكون أشدّ قسوة من صاحب الكتاب إذا قسا) ڕەقتـر نابێت دڵ لە دڵی ئەهلی کتاب ، هیچ دڵێك ڕەق نابێت وەك ڕەقی دڵی ئەهلی کیتاب .

لەترمذیدا لە فەرموودەی ابن عومەردا فەرموویەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( لا تُكثروا الكلام بغير ذكر الله ، فإنَّ كثرة الكلام بغير ذكر الله قسوةٌ للقلب ، وإنَّ أبعد الناس من الله القلب القاسي)

قسە زۆر مەکەن بێ یادی خوای پەروەردگار چونکە قسەی زۆر ئەبێتە هۆی دڵ ڕەقی ،دوور ترین کەسیش لەخوای پەروەردگار ئەو کەسەیە دڵی ڕەقە .

لە مسند البزار لە أنس ـەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)دەفەرموێت: ( أربعة من الشقاء: جمود العين ، وقساوة القلب ، وطول الأمل ، والحرص على الدنيا)

**چوار شت لەبەد بەختی بەنی ئادەمەوەیە ١ـ وشك بوونی چاو فرمێسك نەڕشتن٢ـ ڕەقی دڵ٣ـ زۆر هیوا درێژی بەدونیا ٤ـ زۆر پێداگری لەسەر بەدەست هێنانی دونیا .**

**(بەڕاستی هەرکەس ئەم چوارخاڵەی تێدنەبوو ئەوە ژیانی دونیا ئەباتەوە وە ژیانی ئاخیرەت بۆ خۆی دەستەبەر ئەکات)**

**مالك بن دینار دەفەرموێت: ( مـا ضُرب عبد بعـقوبة أعـظم من قسوة القلب).**
**واتە : بەندە توشی هیچ سزایەك نەهاتووە کەسزا درابێت پێی بەقەد دڵ ڕەقی قورس و گەورە بێت.**

**حُـذیفة المـرعشي دەفەرموێت: ( ما أُصیب أحدٌ بمصیبة أعظم من قساوة قلبه ) رواه أبو نعیم .**
**واتە : هیچ بەڵاو موسیبەتێك نییە بەقەد بەڵاو موسیبەتی دڵ ڕەقی گەورە بێت.**



## هۆکارەکانی دڵ ڕەق بوون :

*زۆر قسەکردن بێ زیکری خوای پەروەردگاروەك لەفەرموودەکەی پێشوی ابن عمر داهات.

* بەڵێن دان بەخوای گەورە وە هەڵوەشاندنەوە وەك ئەوەی دەڵێن خوایە تەواو ئەم تاوانە ناکەین وە ناگەڕێنەوە سەری بەس ئەم جارە ڕزگارمان بێت بەڵام دوای ئەگەڕێنەوە سەری، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ﴾ (المائدة : ١٣)

واتە:جوولەکە بەهۆی ئەوەی کە ئەم بەڵێن و پەیمانەیان شکاند و هەڵیانوەشاندەوە خوای گەورە نەفرەتی لێ کردن و لە ڕەحمەت و هیدایەتی خۆی دەری کردن ، دڵیانمان ڕەق کرد کە پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن.

ابن عقیل ڕۆژێك فەرمووی :ئەی ئەو کەسەی هەست ئەکەیت دڵت ڕەقە ، ئامان ئاگاداربە لەو بەڵێنانەی یاوتە بەخوا شکاندبێتت نەتبردبێتەسەر ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ ...﴾.

*زۆر پێ کەنین ، لەترمذیدا لە الحسن لە أبی هریره لە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:لا تُكثروا الضحك ، فإن كثرة الضحك تُميت القلب.

زۆر پێ مەکەنن ،زۆر پێ کەنین ئەبێتە هۆی مایەی مردنی دڵ.

لەابن ماجە لەڕێگای أبي رجاء الجَزَري ، لە برد بن سِنان ، لە مكحول ، لە واثلة بن الأسقع ، لە أبی هريره فەرموويەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (كثرة الضحك تُميت القلب) واتە : زۆر پێ کەنین دڵ دەمرێـنـێـت.

*زۆر خواردن ، بەتايبەتر ئەگەر حەرام بێت، بشر بن الحارث دەفەرموێت: دوو تايبەت مەندی دڵی مرۆڤـ ڕەق ئەکات ١ـ زۆر قسەکردن ٢ـ زۆر خواردن.

المرُّوذي لەکتێـبـی الـورع دەفەرموێت: قلتُ لأبي عبدالله – يعني أحمد بن حنبل– : يجدُ الرجل من قلبه رقّة وهو شبع ؟ قال : ما أرى

بەئيمامی أبی عبدالله واتە ئيمام أحـمد بن حنبل وترا ئايا هيچ کەسێك نەرمی لەدڵيدا دەبێت کەتێر بێت فەرمووی نابينم شتـی واهەبێن.

*زۆر تاوان کردن،پەروەردگار ئەفەرموێت : ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾

واتە:نەخێر نابێ وابن، وە وانيە وەکو ئەوان کە ئەيڵێن بەڵکو ئەم قورئانە فەرموودەو کەلام و وەحی خوای گەورەيە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ، بەڵکو ئەوەی کە وای لێ کردوون ئيمان نەهێنن ئەوەيە (ڕان) لەسەر دڵيانە.

له المُسند ، والترمذي له أبى هريره ، له پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێت :
( إنَّ المؤمن إذا أذنب كانت نكتةٌ سوداء في قلبه ، فإنْ تاب ونزع واستغفر صُقل قلبه ، وإن زاد زادت حتى يعلو قلبه ، فذلك الران الذي ذكر الله في كتابه : ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾.
واته : کەمرۆڤێك ئیمانداره تاوانێك ئەكات خاڵێكی ڕەش لەسەر دڵی دروست ئەبێت ، ئەگەر تۆبەی كرد گەڕایەوە داوای لێخۆش بوونی لەخواكرد ئەوا دڵی پاك ئەبێتەوە ،ئەگەر تاوانی زۆر كرد ئەو خاڵانە زۆر ئەبێت تادەست ئەگرێت بەسەر دڵیدا ،ئەو خاڵانەش بریتین له (ران) كه پەروەردگار باسی ئەكات ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾.
{حەسەنی بەصری (رضي الله عنه) ئەفەرمووێ: (ڕان): واتە: تاوان لەسەر تاوان ئەكەن تا دڵیان تەواو ڕەش ئەبێ و دڵیان دائەپۆشێ }
هەندێك لەسەلەف دەفەرموون: البدن إذا عري رقّ ، وكذلك القلب إذا قلّت خطاياه أسرعت دمعته .
لاشەی مرۆڤ ئەگەر ڕووت بێت نەرم ئەبێت ، دڵی مرۆڤ ئەگەر خاڵی بوو لەتاوان بەخێرای فرمێسك لەچاوی یەتەخوارەوە .
عبدالله بن مبارك(رضي الله عنه) دەفەرموێت:

رأيتُ الذنوب تُميت القلوب *** ويُـورثـك الـــذُلَّ إدمانـهـا(١)
وترك الذنوب حياة القلوب *** وخيرٌ لـنفـسـك عـصيانهـا(٢)

(١)بينيوومە تاوان دڵی مرۆڤ دەمرێنێت ، بەردەوام بوون لەسەری سەرشۆڕی بۆئەمێنێت

(٢)وازهێنان لەتاوان ئەوە ژیانی دڵە ، بۆتۆباشترە دژایەتی نەفست بکەیت کەبەرەو خراپەت ئەیەنێت

## هۆکاری لابردنی دڵ ڕەقی :

*یادکردنی خودا ، زۆر یادکردنێك دڵ وزمان لەسەری کۆك بن نەك تەنها بە زمان بێت.

المعلّى بن زياد دەفەرموێت:کەسێك بەحەسەنی بصری (رضي الله عنه) فەرموو : سکاڵای ڕەقی دڵم ئەکەم بۆ لای تۆ!! ئەویش پـێـی فەرموو: زۆر زیکربکە ، لەیادی خوای پەروەردگار نزیك بەوە.

وهب بن الورد دەفەرموێت: ( نظرنا في هذا الحديث ، فلم نجد شيئاً أرق لهذه القلوب ، ولا أشد استجلاباً للحق " مِن قراءة القرآن لمن تدبَّره )

سەیری ئەم فەرموودەیەمان کردووە نەمان بینیوە نەمان زانیوە شتێك زیاتر دڵ نەرم بکات وەك قورئان خوێندن بۆ کەسێك ورد بونەوەی تێدابێت.

يحيى بن مُعاذ ، و إبراهيم الخوَّاص دەفەرموون: ( دواءُ القلب خمسة أشياء : قراءة القرآن بالتفكر ، وخلاء البطن ، وقيام الليل ، والتضرّع عند السحر ، ومجالسة الصالحين ) .

چارەسەری دڵ پێنج شتە ١ـ خوێندنی قورئان وردبوونەوە لێی ٢ـ چۆڵی ورگ ٣ـ شەو نوێژکردن ٤ـ پاڕانەوە لەخوا لەکاتی بەرەبەیان (سەحەر)٥ـ دانیشتن لەگەڵ پیاو چاکان لە مەجلیسیاندا.

**بنچینەی لابردنی دڵ ڕەقی وتەی خوای پەروەردگارە دەفەرمویت:**﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴾**( الرعد : ٢٨)**

**واتە: ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە و دڵیان ئارام ئەبێت بە زیکرو یادی خوای گەورە بزانن کە تەنها بە زیکرو یادی خوای گەورە دڵەکان هێمن و ئارام و ئاسوودە ئەبێت.**

**پەروەردگاردەفەرمویت :** ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَاباً مُّتَشَابِهاً مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾ ( الزمر : ٢٣)

**واتە : خوای گەورە ئەو خوایەیە کە باشترین فەرموودەی دابەزاندووە کە قورئانە کە ئەو قورئانە پیرۆزە ئایەتەکانی هەمووی موتەشابیهە واتە: لە جوانی و ڕێکی و تەواوی و بەهێزیدا هەمووی لە یەکتری ئەچێت وە ئەحکام و چیرۆکەکانی، یان خوێندنەوەی دووبارە ئەبێتەوە لە کاتی بیستنی قورئانی پیرۆزدا ئەو کەسانەی کە لە خوای گەورە ئەترسێن بە زانستەوە پێستیان گرژ ئەبێتەوە لە ترسی خوای گەورەدا،پاشان کە گوێیان لە قورئان دەبێت و بە ئومێدی ڕەحمەتی خوای گەورە دەبن پێست و دڵیان نەرم ئەبێ بۆ زیکرو یادی خوای گەورە کاتێك کە زیکری خوای گەورە ئەبیستن.**

**پەروەردگاردەفەرمویت:**﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ﴾**{الحديد:١٦}**

واته:ئایا كاتی ئەوە نەهاتووە باوەڕداران دڵیان نەرم بێ لە كاتی زیكری خوای گەورەو بیستنی قورئان و خوێندنەوەی ، وە لەو حەقەی كە قورئانەو بۆیان دابەزیوە تا ملكەچ و گوێڕایەڵ بن بۆی.

لەفەرموودەی عبدالعزیز بن أبي روَّاد مُرسلاً ، عن النبي صلى الله عليه وسلم : (( إنَّ هذه القلوب تصدأ كما يصدأ الحديد )) وتيان : فما جلاؤها يا رسول الله؟ فةرمووي : (( تلاوةُ كتاب الله ، وكثرة ذكره ))

ئەم دڵە وایە ژەنگ هەڵدەیەنێت وەك چۆن ئاسن ژەنگ هەڵدەیەنێت ،وتیان ئەی چی شتێك لای ئەبات ئەی پێغەمبەر(ﷺ)،فەرمووی خوێندنی كتێبی خوا (قورئان)زۆر یادكردنی.

❋چاكەكردن لەگەڵ كەسانی هەتیوو كەم دەرامەت هەژار ، ابن أبي الدنيا : حدثنا علي بن الجعد ، حدثني حمَّاد بن سلمة ، عن أبي عمران الجوني ، عن أبي هريرة : أنَّ رجلاً شكى إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم قسوةَ قلبه ؟ فقال: (( إنْ أحببت أنْ يلين قلبك " فامسح رأس اليتيم ، وأطعم المساكين)) كەسێك هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) شەكوای كرد لای پێغەمبەر(ﷺ)كە دڵی ڕەقە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر حەزدەكەیت دڵت نەرم بێت دەست بهێنە بەسەر كەسی هەتیوا ، خواردنی هەژاران بدەن .

لە أبو نُعيم أنَّ أبا الدرداء كتب إلى سلمان : ارحم اليتيم وأدنه منك ، وأطعمه من طعامك . فأنّي سمعت رسول الله (ﷺ) وأتاه رجلٌ يشتكي قساوةَ قلبه ؟ فقال : (( أتحب أنْ يلين قلبُك ؟ )) فقال له : نعم . فقال : (( ادن اليتيم

**منك وامسح رأسه ، وأطعمه من طعامك ، فإنَّ ذلك يُلين قلبك ، وتقدر على حاجتك)).**

**ڕەحـمت هەبێت بەرامبەر هەتیوو لـە خۆتی نزیك كەوە ،ئەو خواردنەی خۆت ئەیـخۆی بەوی بدە ،كەسێك هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) شەكوای دڵی خۆی ئەكرد كە ڕەقە؟ پێـی فەرموو: ئایا حەز ئەكەیت دڵـت نەرم بێت !ئەویش فەرمووی بەڵێ ،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی كەسی هەتیوو لـەخۆت نزیك كەوە دەست بهێنە بەسەریدا وە ئەو خواردنەی خۆت ئەیـخۆیت لـەوەی پێ بدە،چونكە ئەوە دڵـت نەرم ئەكات توانات ئەشكێت بەسەر هەموو پێداویستیەكانتا.**

**نقلّ كراوە لـە أبو طالب دەفەرموێت: پیاوێك پرسیاری كرد لـە باوكی عبدالله ـ ئیمام أحـمد بن حنبل ـ فەرمووی : چۆن دڵـم ڕەق ئەبێت چۆن دڵـم نەرم ئەبێت!؟ فەرمووی زۆر سەردانی گۆڕستان بكە دەست بهێنە بەسەری هەتیوا.**

**❋زۆر یادی مردن بكەیت ، عن ابن أبي الدنیا بإسناده ، عن منصور بن عبدالرحمن ، عن صفیة : أنَّ امرأة أتت عائشة تشكو إلیها القسوة ؟ فقالت : أكثري ذكر الموت " یرقّ قلبك ، وتقدرین على حاجتكِ . قالت : ففعلت ، فأنِستْ من قلبها رشداً فجاءت تشكر لعائشة رضي الله عنها.**

**ئافرەتێك هات بۆلای دایكمان عائشە (ﷺ) شەكوای دڵ ڕەقی خۆی ئەكرد پێی فەرموو: زۆر یادی مردن بكە دڵـت نەرم ئەبێت و ئەتوانی پێداویستیەكانت جێ جێ بكەیت ، ئافرەتەكە ئەوەی ئەنـجامدا لـەدڵـیدا هەستی بەوە كرد دڵـی بەرەو نەرمی ئەچێت هات سوپاسی دایكە عائیشە(ﷺ) كرد.**

ئەمەش ئەدەبێکی جوان بۆ ئێمە وە دەرزێکە کە کەسێك شتێکت بەرامبەر ئەکات سوپاسی بکەیت وە دەست خۆشی لیٚ بکەیت.

زۆرێك لەسەلەف فەرموویانە: : لە سعيد بن جبير وربيع بن أبى راشد کەدەفەرموون: لو فارق ذكرُ الموت قلوبنا ساعة لفسدت قلوبنا.

ئەگەر بێت و یادی مردن لەدڵماندا لاچێت و نەمێنێت بەیەك کاتژمێر تەواوی دڵمان خراپ ئەبێت.

لە السُّنن ـدا هاتووە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرمێت: ( أكثروا ذكر هاذم اللّذات ـ الموت ـ ) .

واتە : زۆر یادی ئەو شتە بکەن کەخۆشیەکان لەناو ئەبات ـ ئەویش مردنە ـ .

عطاء الخراسانى دەفەرموێت : مّر رسول الله صلى الله عليه وسلم بـمجـلس قد استعلاه الضحك ! فقال : (( شُوبوا مجلسكم بذكر مكدِّر اللّذات )) قـالـوا : وما يُكدر اللّذات يا رسول الله ؟ قال : (( الموت)) .

پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆشت بەلای مەجلیسێکدا کە بەتەواوی پێکەنین باڵی کێشابوو بەسەریدا ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی مەجلیسەکانتان تێکەڵ بکەن لەگەڵ ئەوشتەی کەهەموو خۆشیەکان لێڵ ئەکات ، وتیان ئەوشتە چییە هەموو خۆشیەکان لێڵ ئەکات ؟ فەرمووی مردن.

{بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت بەلای هەر مەجلیسێکدا تێپەڕبوویت پێکەنین باڵی کێشابوو بەسەریدا یەکسەر قسەبکەیت چونکە هەندێك کات ئەبێتە هۆی ناشرین بوونی خۆت ڕق لیٚ بوونەوە لە دینەکە ، چونکە ئەوەی ئامۆژگاری ئەکرد پێغەمبەربوو (ﷺ) وە ئەوەشی ئامۆژگاری دەکرا صەحابە بوون زۆر

**لەئێمە باشتر بوون وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ( خَيْرُ الْقُرُونِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ) (روى البخاري (٢٦٥٢) ، ومسلم (٢٥٣٣))**

**واتە: باشترین خەڵک ئەو کەسانەن کەلەسەردە مـی مندا ژیاون پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن ، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن .**

**ئاسایـیە ئەگەر بزانیت ئەو کەسانە گوێت لـێ ئەگرن ئامۆژگاریان بکەیت بۆ ئەوەی کە پێ دەکەنن هەموودانیشتنەکەیان هەرپێ کەنین نەبێت ببێتە هۆی ئەوەی لـەیادی خوا خافڵبن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (( مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيـمَانِ)) (رواه مسلم٤٩ )**

**واتە: هەر کەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی ئەوا با بە دەست بیگۆڕێ ، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێ ، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت ،ئەوە لاوازترینی ئیمانە**

**گەر زانیت گوێت لێناگرێت و خراپەی زیاتر ڕووئەدات ئەوە قسە مەکە پەروەردگار ئەفەرموێت:﴿ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾{البقرە:٢٨٦}**

**لـەهەندێك کاتدا کەئەمە ڕوو ئەدات قسە نەکەیت باشترە چونکە جاری واهەیە ئەو کەسانەی ئامۆژگاریان ئەکەیت توڕە ئەبن وە جوێن دەدەن خراپەیان زیاتر ئەبێت لـە خراپەی یەکەم جاریان بۆیە باشتـر وایە قسە نەکەیت وە قاعیدەیەکی فقهیش هەیە ( ئەگەر دوو خراپە کۆبێتەوە لـەیەك کاتدا ، بەناچاری ئەوا ئەو خراپەیە هەڵئەبژێریت کەتاوانی کەمتـرە) .**

*زۆر سەردانی کردنی گۆڕستان بیر کردنەوە لەحاڵی ئەو کەسانەی لەگۆڕدان ئەو کۆتاییان بوو،لەپێشوودا باسمان کرد کەپرسیار لە ئیمام أحمد کرا کەچی دڵ نەرم ئەکات فەرمووی سەردانی گۆڕستان بکە.

لە صحیح مسلم : لە أبی هریرە، لە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ( زُوروا القبور فإنها تُذكِّر الموت )

واتە: سەردانی گۆڕستان بکەن چونکە مردنتان بیر ئەهێنێتەوە .

لە بُریدە ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (كنت نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها ، فإنَّها تذكر الآخرة)

واتە: من پێشتر ڕێگریم لێکردن سەردانی گۆڕستان بکەن ،سەردانی بکەن چونکە مردنتان بیر ئەهێنێتەوە.(رواه أحمد ، والترمذي وصححه)

لە أنس، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:كنت قد نهيتكم عن زيارة القبور ، ثم بدا لي أنَّه تُرقُّ القلب ، وتُدمع العين ، وتُذكر الآخرة ، فزوروها ولا تقولوا هُجرا.(رواه الإمام أحمد ، وابن أبي الدنيا)

واتە: من پێشتر ڕێگریم لێکردن سەردانی گۆڕستان بکەن ، بەڵام ئێستە بۆم دەرکەوتووە دڵ نەرم ئەکات وە فرمێسك بەسەرچاواندا ئەیەنێتە خوارەوە ، ئاخیرەتان ئەخاتەوە بیر،شین و شیوەن بۆ مردوو نەکەن.

باسی کردووە ابن أبی الدنیا لە محمد بن صالح التمار دەفەرموێت:صفوان بن سلیم هەموو ڕۆژانی هەفتە ئەهاتە گۆڕستانی بقیع ،ڕۆژێك دوای کەوتم وتم واللە ئەبێت بزانم چی ئەکات، دەموو چاوی خۆی شاردەوە بە ماسکێك لەسەر گۆڕێك ئەوەندە گریا هەتا من بە زەیم پێداهاتەوە وام زانی گۆڕی

کەسێکێتـی ، ڕۆژێکی تر هاتەوە دووبارە شوێنـی کەوتـمەوە ، لەلای گۆڕێکی تردانیشت دووبارە وەك یەکەم جار زۆرگریا من بەزەیم پێدا هاتەوە ،ئەو شتەی ڕویدا بۆ مـحمد بن الـمنکدر گێڕایەوە پێم وت وام زانیوە کەئەمە گۆڕی کەس و کاری ئەون ، مـحمد بن الـمنکدر فەرمووی ئەوان هەموویان ئەهلی ئەون کەس وکاری ئەون برای ئەون،کاتێك کەسێك لەمانە مردووە وای دائەنێت بەیانی سەرەی ئەمیش دێت ئەو پیاوێکە دڵی خۆی ئەجولێنێت بەیادی مردن هەرکات هەستی بەدڵ ڕەقی بکردایە ، پاشان مـحمد بن الـمنکدر ـم بینـی ئەچوو بۆ گۆڕستانی بقیع سەلامم لێکرد مـحمد بن الـمنکدر فەرمووی ئایا ئەوەی صفوان هیچ کاری لەتۆ نەکرد!،وام هەستکرد ئەمیش سودی لەوە وەرگرت کەبۆم باسکرد ئەمیش هەموو ڕۆژ دێت بۆگۆڕستان.

گێڕاو یانەتەوە ئافرەتێکی پیر لەتیرەی عبدالقیس زۆر سەردانی گۆڕستانی ئەکرد لەسەر ئەوە سەرزەنشتیان ئەکرد ،بۆ زۆر ئەڕۆیت بۆگۆڕستان ؟ ئەویش فەرمووی دڵی ڕەق ئەگەر هاتوو سەرپێچی کردوو لەفەرمانی خوا لایدا هیچ شتێك نەرمی ناکات ئیلا لەئاسەواری شوێنی کۆن نەبێت کەتیاچوون،کە ئەچمە گۆڕستان ئەوانەی لەناو گۆڕەکەیان واهەست ئەکەم لەناو گۆڕەکەیان بهێنە دەرەوە ، بۆیان ئەڕوانـم سەیریان ئەکەم ،ئەو دەمووچاوانە تۆز گرتویەتی ئەو جەستەیە گۆڕاوە لەناو خاکدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە ،ئەو لاشەیەیەی مرۆڤ بەبەردەوامی خزمەتی ئەکات ،ئەو جلە جوانانەی لەبەری ئەکەیت ئێستا کفنێکی زەردی دڕاوت لەبەردایە ئای چی دیـمەنێکە (بیـربکەوە) ، چەند

سزایەكی سەختە تاڵی ئەمە لای نەفس چەند ناخۆشە بۆ مرۆڤـ كەبزانێت لاشەی ئاوای لێدێت لەژێر خاكدا.

زیاد النمیـری دەفەرموێت : هیچ كاتێك موشتاقی گریان نەبووم ئیلا كەبەلای گۆڕەكاندا ڕۆشتووم ، پیاوێك وتی:چۆن؟ فەرمووی: هەركاتێك ئەمەم بوێت ڕۆشتووم بۆ گۆڕستان دانیشتووم لای هەندێك لەو گۆڕانە بیرم لەوە كردۆتەوە ئەوان ڕۆشتن گەیشتن بەچی ،چیان لێهاتووە چۆن جەستەیان ڕزاوە ، بیرم لەوە كردەوە لەوەی ئێمەش مۆڵەتـمان پێدراوە ،ئیتر حاڵی من ئەگۆڕێت بۆ حاڵێكی تر.

ئیمام دەفەرموێت:

أفي دار الخـراب تظل تبني *** وتـعـمر مـا لعمران خُلقتا
ومـا تركت لـك الأيام عذراً *** لقـد وعظتك لـكن ما تعظتا
تُنـادي للـرحيـل بكل حين *** وتُعلن إنّـمَا المقصـودُ أنتا
وتُسمعـك النـداءَ وأنت لاهٍ *** عن الداعي كـأنَّك ما سمعتا
وتعلم أنَّه سـفـرٌ بـعـيـد *** وعـن إعـداد زادٍ قد غفلتا
تنـام وطالـب الأيـام ساعٍ *** وراءك لا يـنام فكيـف نمتا
معائب هـذه الـدنيـا كثير *** وأنـت علـى محبّتـها طُبعتا
يضيع العمرُ في لعـبٍ ولهو *** ولو أُعطيت عقلاً ما لعـبتـا
فما بعد الممات سـوى جحيم *** لعـاص أو نـعيم إنْ أطعتـا
ولست بآملٍ باطلٍ رداً لدنيا *** فتعـملُ صـالحاً فيما تركتـا
وأوَّلُ من ألوم اليوم نفسـي *** فقد فعلتْ نظائـرَ مـا فعلتـا
أيا نفسي أخوضاً في المعاصي *** وبعد الأربعين وفيت ستـا
وأرجـو أنْ يطول العمرُ حتى *** أرى زاد الـرحيـل وقد تأتّى

أيا غُصن الشباب تميل زهواً *** كأنك قد مضى زمـن وشبتا
علمتَ فدع سبيلَ الجهل واحذر *** وصحح قد علمتَ وما عملتا
ويا من يجمع الأموال قـل لي *** أيمنعك الرّدى ما قد جمعتـا
ويا من يبتغي أمـراً مطاعاً *** ليسمع نافـذاً مَن قـد أمـرتا
عججت إلـى الولاية لا تُبالي *** أجرت علـى البرية أم عدلتا
ألا تـدري بـأنك يوم صارت *** إليك بغـير سكـين ذُبـحتـا
وليس يقوم فرحةُ "قد تولّـى" *** بترحة يوم تسمع "قد عُزلتـا"
ولا تُهمل فإن الوقت يسري *** فإنْ لم تغتنمه فقـد أضعتـا
ترى الأيام تُبلي كـل غُصن *** وتطوي مِن سرورك ما نشرتا
وتعلـم إنّمـا الدنيـا منـام *** فأحلـى ما تكون إذا انتبهتا
فكيف تصدّ عن تحصيل باق *** وبـالفاني وزخرفـه شُغلـتا
هـي الـدنيا إذا سرتك يوماً *** تسوؤك ضعف ما فيها سُررت
تغرّك كـالسراب فأنت تسري *** إليه وليـس تشعر إن غُررتا
وأشهد كـمْ أبادت من حبيب *** كـأنك آمن ممـا شهـدتـا
وتـدفنهم وتـرجع ذا سُرور *** بما قـد نلت من إرث وحرثا
وتنساهـم وأنت غداً ستفنى *** كـأنك مـا خُلقت ولا وجدتا
تُحِّـدث عنهم وتقـول: كانوا *** نعم كـانوا كمـا والله كنتـا
حديثك هـم وأنت غداً حديثٌ *** لغيرهم فـأحسن ما استطعتا
يعود المرء بعد الموت ذكراً *** فكن حسن الحديث إذا ذُكرتا
سـل الأيام عـن عم وخال *** وما لك والسؤال وقد علمتا
ألست تـرى ديـارهم خلاءً *** فقد أنـكرت منها ما عرفتا

ئایاتۆ لەخانوو مالێکدا کەلەناو ئەچێت(دوونیا) تۆ لەویا خەریکیت بونیاتی مالْ و حالّی خۆت ئەنێت خەریکیت ئاوەدانی ئەکەیتەوە لەکاتێکدا تۆبۆ ئەوە دروست نەکراویت .

❋❋❋❋

ئەم ڕۆژگارە هیچ پاساوێکی بۆنەیەشتویت ئامۆژگاری کردوویت تۆ ئامۆژگاریت وەرنەگرتووە (ئەو شتانەی لەچوار دەورمان ڕوو ئەدەن هەمووی پەند و ئامۆژگاریە بۆ مرۆڤی ئاقلْ).

❋❋❋❋

هەموو ڕۆژێك ڕۆژگار بانگت ئەکات بۆ ڕۆشتن( بۆگۆڕ) ئاشکراشی ئەکات مەبەست لەبانگ کردنەکە تۆی.

❋❋❋❋

هەمووڕۆژێك ئەم بانگە ئەدات بەگوێتدا بەلاّم تۆ بێئاگای لەو بانگەوازکارە وەك ئەوەی کە هەر نەتبیستبێت .

❋❋❋❋

تۆ دلّنیایت و ئەزانیت کە سەفەرێکی زۆر دوورە ، بەلاّم لەئامادەکردنی تێشوو تەواو بیّ ئاگایت.

❋❋❋❋

تۆ بۆخۆت خەوتوویت و خەلّکی تر هەولّدەدەن و خەریکی کۆشش ، ئەوانەی پشتی تۆ نەخەوتوون تۆ چۆن دەخەوی ؟

❋❋❋❋

عەیب و عارەکانی ئەم دوونیایە زۆرن ، بەڵام تۆ بە سروشتت حەزت بە خۆشەویستی دونیایە .

❋❋❋❋

تەمەنت بەزایە ئەڕوات لـە گەمەو گەپ ،گەر بێتوو ئەقڵت پیێ بدرایە سەرقاڵی گەمەوگەپ نەئەبووی .

❋❋❋❋

لـەدوای مردن هیچ ڕێگایەکی ترنییە یان بەهەشت یان دۆزەخ بەهەشت بۆ ئەو کەسەیە گوێڕایەڵی فەرمانی خوای کردووە جەهانـمیش بۆ ئەوکەسەیە سەرپێچی فەرمانی خوای کردووە.

❋❋❋❋

تۆ هەرگیز هیوات نییە بگەڕێتەوە بۆ دوونیا تا کردەوەی چاك بکەیت لـەوە ماوەیەی کە کردەوەت تێدا نەکردووە .

❋❋❋❋

یەکەم نەفسێك لـۆمەی بکەم نەفسی خۆمە ،هەموو ئەوشتانەی نەفسی تۆ ئەنـجامی داوە نەفسی منیش ئەنـجامی داوە.

❋❋❋❋

ئەی نەفسم هەتا ئێستا ڕۆچوون لـەتاوان لـەدوای چل و شەش ساڵ تەمەن .

❋❋❋❋

تەمەنا ئەکەم تەمەنـم درێژ بێت تاتوێشووی سەفەرم ببینم کە ئامادەکراوە بۆم

❋❋❋❋

ئەی گەنـجێتـی چۆن بوو بەلق و پۆپی دارێك ئەی ئەو لقەی گەنـجی شۆڕو لارو خوارئەبیتەوە بەهۆی بەسەرچوونی تەمەنت ،هەروەك ئەوەی پیـر بوویت .

❋❋❋❋

تۆ تەواو زانیت ڕێگای ناسینی خوا چییە بەسە واز لـەڕێگای تاوان و نەزانی بهێنە،ئاگاداربە لـەوەی کە زانیوتە و کارت پێی نەکردووە .

❋❋❋❋

ئەی ئەو کەسەی بەردەوام پارە کۆئەکەیتەوە ، ئایا ئەوەی کۆتکردوەتەوە ڕزگارت ئەکات لـەمردن و تیاچوون!!.

❋❋❋❋

ئەی ئەوکەسەی چاوەڕێ ئەکەیت کەخەڵکی دەست لـەسەر سنگ دانێت بۆت ،گوێڕایەڵیت بکەن وە قسەت بـبـیسترێ و جێ بەجێ کردنی هەموو ئەوشتانەی تۆ داوای ئەکەیت.

❋❋❋❋

تۆ واهاتووی بەرەوە دەسەڵات گوێ نادەی بەوەی داد پەروەر ئەبیت لـەگەڵ ئەوەی زوڵم لـە خەڵکی بکەیت تەنها ئەتەوێت ببیت بەسەردار و گەورەی خەڵك.

****

ئایا نازانی ئەو ڕۆژەی دەسەڵات هات بۆلای تۆ ،سەربڕایت بەبێ چەقۆ.

****

هەرگیز خۆشی ئەوکاتەی دەڵێن فلانەکەس بووە بە دەسەڵاتدار ،لەبەرامبەر ئەو ناخۆشیە ناوەستێ کەفلانە کەس لەدەسەڵات لابراوە.

****

هەرگیز ئیهمال مەبە هیچ شتێك بەئیهمالی مەکە ،کات ئەڕوات ناوەستێت ، ئەگەر تۆ ئەو نەقۆزیتەوە ئەوە ئەو تۆ دەقۆزێتەوە و لێت هەڵدێ .

****

تۆ ئەو ڕۆژگارە دەبینیت هەموو ئەوشتانەی کە گەنجێتی ،چڵی دارێك لەناو ئەبات و ئەیان ڕزێنێت هەموو ئەو خۆشیانەی کۆت کردۆتەوە بەبای ئەدات.

****

تۆ دەزانیت ئەم دوونیا خەوێکە باشترین کاتیش ئەو کاتەیە کەبەخەبەریت.

****

چۆن پشت ئەکەیتە ژیانێك کە ئەمێنێتەوە ، بۆشتێك کە نامێنێت بە ڕازاوەیەتێکەی سەرقاڵبووی

****

**ئەم دوونیا ڕۆژێك دڵ خۆشت بكات زۆر لەوەزیاتر بەخراپترەوە دێت بێزارت ئەكات.**

**ڕۆژگارێكە ئەگەر سەیرت كردبێت بۆت ڕوانیبێت كەسێك بۆ ساتێك(بۆ ڕۆژێك)دڵی خۆش بوبێت بۆ چەندات سات (چەندین ڕۆژ)بێ تاقەت بووە .**

❋❋❋❋

**ئەم دوونیا ئەتخەڵەتێنێت هەروەك سەرابێك بۆی ڕائەكەیت ، تۆ نازانیت بە دڵنیایەوە خەڵەتاوی.**

❋❋❋❋

**من شایەتی ئەدەم چەندین كەسانی خۆشەویستی لەیەك كردن و بردنی وەك لەوەی تۆ دڵنیا بیت لەوەی بەچاوی خۆت بینیووتە**

❋❋❋❋

**بەڵام كەئەگەڕایتەوە دڵت خۆش دەبوو بەوەی كە شتێكت بۆ ماوەتەوە لە میرات و ماڵ**

❋❋❋❋

**تۆ ئەوان لەبیر ئەكەیت بەڵام تۆش سبەینێ تیائەچیت وەك ئەوەی هەرنەهاتبیتە دوونیا و بونت نەبووبێ .**

❋❋❋❋

**تۆ قسەئەكەیت لەبارەی ئەوان دەڵێت وایان كردووە وابوون ، بەڵام تۆش سەردەمێك دێت وات پێ ئەوترێ.**

❋❋❋❋

ئێستا قسەی تۆ باسی ئەوانە بەڵام سبەینێ ئاگاداربە تۆش ئەبیتە باسی خەڵك بۆیە چاك بە تا دەتوانی .

❋❋❋❋

کەمردیت ئەبیتە باس وخواسی خەڵك وابکە بەچاکە باس بکرێت.

❋❋❋❋

پرسیار لە مام و خاڵ و هەموو کەسەکانت بکە!! چیت داوە لە پرسیار لە کاتێکدا تۆ هەموو ئەو پرسیارانە دەزانی خۆت .

❋❋❋❋

تۆ نابینیت ماڵ و حاڵی ئەوان چۆنە کەسی تیانییە ،بەڵام تۆ ئەزانیت و ئینکاری ئەکەیت.

❋❋❋❋

زۆر ماڵی ناسیاومان چۆڵ بوو بەڵام ئەگەر بەزمان نەیلێت ئەوانمان لەبیرکردووە بەڵام کردەوەکانمان شایەتە چونکە مردنمان لەبیر کردووە.

❋❋❋❋ ❋❋❋❋ ❋❋❋❋

❋سەیرکردنی ماڵ و حاڵی ئەوکەسانەی کەتیاچوون،وانە وەرگرتن لەوانەی ئێستا نەمان

گێڕاویەتیەوە ابن أبی الدنیا لەکتێبی (التفکر والاعتبار) هێناویەتی لە عمر بن سُلیم الباهلی ، لە أبی الولید دەفەرموێت: ابن عمر بیوتایە دڵی خۆی بەسەر ئەکاتەوە ئەهات ئەو شوێنانەی ڕووخاون بەس ئاسەوارەکانیان ماوە ،ئەوەستا لەبەردەم دەرگاکە بە دەنگێکی غەمبارانە بانگی ئەکردن کوا خاوەنەکەت کوا کەس و کارەکەت کوا ئەوانەی لەنێویدا ئەژیان لەمماڵە ڕازاوە کۆنەدا ،دەی فەرموو هەمووشت تیا ئەچێت تەنها خوای پەروەردگار نەبێت.

هاتووە لەکتێبی(القبور) هێناویەتی لە محمد بن قدامە دەفەرموێت: ربیع بن خثیم ئەگەر رەقی لەدڵدا بووایە ئەهات بۆ ماڵی هاوڕێیەکی کەوەفاتی کردووە بەشەو ئەهات ئەی فلاّن کەسی کوڕ فلاّنە کەس ،ئەی هاوار بۆخۆم چی بلێم چی باس بکەم چیت کرد لەکردەوەی خراپ یان باش وە ئێستا چیت بەسەرهاتووە بەرەو کوێ ڕۆشتی کۆتایت چییە پاشان ئەگریا.

❋خواردنی حەلاّڵ ،گێڕاویەتیەوە أبو نعیم جگەلەویش، لەڕێگای عمر بن صالح الطرسوسي دەفەرموێت:ڕۆشتن بۆلای ئیمام أحمد پرسیاریان لێکرد بەچی دڵ نەرم ئەبێت ئەی باوی عبدالله سەیری هاوەلاّنی کردوو چاوی نوقان وپاشان چاوی کردەوە وتی کوڕی خۆم بەخواردنی حەلاّڵ ، ڕۆشتم بۆلای أبی نصر پێم وت ئەمەوێت دڵم نەرم بێت فەرموی ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾وتم من لای باوکی عبدالله هاتووم،وتی چی شتێکی پێ فەرمووی باوکی عبدالله؟ وتم فەرموویەتی بەخواردنی حەلاّڵ .

هاتمەوە بۆلای باوکی حەسەن وتم بەچی شتێك دڵی مرۆڤ نەرم ئەبێت ئەویش هەمان ئایەتی خوێندەوە ، وتم من لای باوکی عبدالله هاتووم ،هەردوو

**گۆنای سوربۆیەوە لەخۆشیدا وتی چی فەرمووە؟ وتـم فەرموویەتی بەخواردنی حەڵاڵ،وتی بنچینەی بابەتێکیی پێوتویت.**

**{ئێستا هەموو ڕێگاکانت زانی بۆیە ئێستا ئەوڕێگایە هەڵبژێرە کەبۆت گونـجاوە }.**

**سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی تاك و تەنهایە .**

وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ